ئەی موسوڵمانی ئازیز ، بە پشتیوانی الله عز وجل لەم نامیلکەیەدا باسی پێشەکییەک ئەکەین بۆ روونکردنەوەی بیروباوەر(عەقیدە)، کە بناغەی ئیسلامە و گرنگییەکی زۆری هەیە.
بەشێوەیەک تەنانەت دوارۆژی ئێمە لەسەری وەستاوە وەک موسوڵمان، مەبەستمان لە دووارۆژ لێرەدا رۆژی دواییە کە ئایا بەهەشتە یاخوود دۆزەخ پەنا ئەگرین بە رحمان.

## بزانە موسوڵمانی ئازیز :

- پێغەمبەران (علیهم السلام) هەموویان لەسەر یەک دین بوون ئەویش دینی (الإسلام) ە.
- وە هەموویان یەک هەڵوێست بوون لەسەر ئەسڵی ئەم دینە ئەویش (تەوحید) ە.
- ئیسلام دینی هەموو پێغەمبەران بووە هەر لە نوح تاوەکو محمد [علیهم السلام] هەموویان لەسەر یەک دین بوون بێ جیاوازی وەکو الله تعالی دەفەرمووێت:
﴿ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحاً إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ * وَإِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ ﴾ {المؤمنون_٥٠_٥١}
- وە مانای [امتكم امة واحدة] لەو ئایەتەی سەرەوە واتە ئەی پێغەمبەران هەمووتان دینەکەتان یەک دینە و یەک میلەتە ئەویش بانگکردنی مرۆڤە بۆ پەرستنی الله ﷻ بە تاک و تەنها بەبێ شەریک بۆ دانانی .[ابن کثیر]
- وە لە فەرموودەیەکی تر کە ئیمامی مسلم و ئەوانی تر گێراویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:
﴿ الْأَنْبِيَاءُ إِخْوَةٌ من عَلَّات وَأُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ﴾
- البغوي لە (شەرحی السنة) دەفەرمووێت: بەراستی دینی هەموو پێغەمبەران یەک شتە لە کاتێکدا شەریعتەکانیان جیابوون، وەکو چۆن ئەو منداڵانەی کە باوکیان یەکە [العلات] بەڵام لە دایکی جیاوازن...
- بەڵگە زۆرن لە قورئان بۆ نموونە الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ {الانبياء ٢٥}
- کەواتە موسوڵمانی بەرێز لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە تەنها شەریعەتەکانیان جیابوون وە بەڵگەش ووتەی الله تعالی-یە هەر وەک دەفەرمووێت:
﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجا ﴾ {المائدة ٤٨ }

هەر بۆیە هەموو پێغەمبەران تەنها بۆ ئەو مەبەستە نێردراون کە بانگکردنی خەڵکە بۆ تەوحید و پەرستنی الله ی دروستکەری ئەرز و ئاسمانە بە ملکەچی، وسبحان الله عما یشرکون.

ئەی موسوڵمانی ئازیز ،بەم شێوەیە زانیمان کەوا هۆکاری ناردنی پێغەمبەران و مەنهەج و شەریعەتییان بە چی جۆرێک بووە کە ئەمەش زۆر گرنگە موسوڵمان بیزانێت.

**دێینە سەر بابەتێکی گرنگی تر کە لە خوارەوە بە چەند خاڵێک ئاماژەی پێ کراوە:**

## ماناى ئیسلام چیە ؟

واتە تەسلیم بوون بۆ بەیەکخواپەرستی اللە ﷻ بە گوێرایەڵی وخۆ پاککردنەوە لە شەریک و بڕیاردان بۆ اللە ﷻ.
قال تعالى: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ ﴾ { النساء ٢٥}
واتە: کێ هەیە ئاینی چاکتر بێت لەو کەسەی ڕووی کردۆتە اللە و خۆی سپاردبێ بە اللە ﷻ و نیەتی پاک بێت لە کردارەکانی و بەپێی شەریعەتی اللە ﷻ بجولێتەوە.
هەروەها دەفەرموویێت : ﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ﴾ {لقمان ٢٢}
.واتا ( ئەوەی ڕوو بکاتە پەروەردگاری و نیەتی پاک بێت لە کارەکانیدا پابەند بێت بە شەریعەتی اللە ﷻ، ئەوە پەیمانی لە لایەن اللە ﷻ وە بۆ دراوە کە سزا نەدرێت ).
هەروەها دەفەرمووێت : ﴿فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَلَهُ أَسْلِمُوا وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ﴾ {الحج ٣٤}
واتا ( پەروەردگاری ئێوە پەروەردگارێکی تاک و تەنهایە هەمووتان تەسلیم و ملکەچی ئەو بن و مژدەش بدە بەو بەندانەی ملکەچ و ڕازین بە بڕیاری اللە ﷻ ).

## کەواتا زانیمان ئیسلام چییە، با ئێستا بزانین موسڵمان کێیە ؟

بزانە رەحمەتی پەروەردگار برژێت بەسەرتدا موسوڵمان واتا ئەو کەسەی خۆی تەسلیمی اللە کردووە ملکەچیەتی، ئەوەی فەرمانی پێ کردووە دەیکات وە ئەوەی نەهیی(ڕێگری) لێ کردوە لێی دوور دەکەوێتەوە...
ناڵێ: بۆ ؟!
ناڵێ: ئاخر چۆن ؟!
ناڵێ: چۆن وائەبێ ؟!
بەڵکو ئەڵێ: بیستمان و گوێڕایەڵی بووین.
هەر ئەمەش ماناى {ئیسلامە}
واتا تەسلیم بوون بە اللە ﷻ
کەواتا مادام خۆمان بە موسڵمان ئەزانین نابێت حوکمەکانی اللە بە کۆنە پەرستی و دواکەوتوویی دابنێین. هەروەها نابێت بڵێین کاتی ئەم حوکمانە بەسەرچووە بۆ ئەم سەردەمە نابێت، وە نابێت بە زۆر ماناکانی بگۆڕین تا دڵی دوژمنانی دینی اللە پێ ڕازی بکەین لە ترسی ئەوەی نەوەک گاڵتە بە دینەکەمان بکەن یاخوود لەپێناو بەدەستهێنانی دەستکەوتێک لەدونیا.
بۆیە نابێت شەرم بکەین و ئەو گفتارانە بڵێین و ئەو کردارانە جێ بەجێ بکەین کە خالقمان بۆمانی داناوە. و دەبێت ئازا و بە جەرگ بین وەک پێشەوامان محمد صلى اللە علیە وسلم،

بەڕاستی گەر بەحەق ئەو بکەینە پێشەوای خۆمان ئەوا سەرفراز دەبین.

ئەی موسوڵمانی ئازیز، لەم رۆژگارەدا و لەم سەردەمەدا بابەتێک هەیە زۆر نامۆیە لە نێو کۆمەڵگەی موسوڵمان ئەویش (تەوحید)ە، کە نادیار و شاردراوەتەوە و باسی ناکرێت لە کاتێکدا:

## تەوحید مافی اللّٰه -یە بەسەر بەندەکانیەوە

وە لە پێناو گێڕانەوەی ئەم مافە بوو بۆ اللّٰه ﷻ
دژایەتی {پێغەمبەر نوح علیە السلام} کرا
{پێغەمبەر ئیبراهیم علیە السلام} خرایە ناو ئاگرەوە
{پێغەمبەر محمد ﷺ} سزادرا وشاربەدەر کرا
چەندەها پێغەمبەری تر لەپێناویدا ناڕەحەتیان بینی -سەلامی خوا لە هەموویان بێت.
لەشکرێک لە حەقبێژان وهەڵگرانی ئەشکەنجەیان چەشت.
گەورەترین حیکمەتی جیهاد وتێکۆشان لە ئیسلامدا گێڕانەوەی مافی یەکخواپەرستێتی خالقی خەلکە، وچەسپاندن وتەحقیقکردنی تەوحیدە کە ئەهلی کوفر پێشێلیان کردووە، وڕێگا بۆ زەوتکردنی خۆشدەکەن.
تەوحید ئامانجی سەرەتا وکۆتایی بانگەوازی پێغەمبەران بووە، بەڵام ئێستا زۆرینەی بەناو میراتگرەکانی پێغەمبەران ئەم مافە دەشارنەوە لە پێناو مەرامی خۆیان و بۆ رازی کردنی ستەمکاران.
<u>ئەی موسوڵمانی خۆشەویست بزانە:</u>
تەوحید پێش هەموو شتێکە تەنانەت پێش نوێژ و قورئان پێش خوێندنی هەموو عیلمەکانی ترە {پێغەمبەر ﷺ} ئاوا فێری اصحابەکانە کردووە { الایمان قبل القران }.

{ عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: "كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ فِتْيَانٌ حَزَاوِرَةٌ، فَتَعَلَّمْنَا الْإِيمَانَ قَبْلَ أَنْ نَتَعَلَّمَ الْقُرْآنَ، ثُمَّ تَعَلَّمْنَا الْقُرْآنَ، فَازْدَدْنَا بِهِ إِيمَانًا "} رواه ابن ماجه {٦١} وهو حديث صحيح.
واتا:{ لە جوندوبی کوڕی عبداللە-ەوە دەفەرموویێت : لەلای پێغەمبەر «ﷺ» بووین هەمووومان گەنجانێکی بەهێز بووین فێری ئیمانی دەکردین پێش ئەوەی کە قورئانمان فێر بکات پاشان قورئانی فێر دەکردین، ئیمانمان پێی زیادی دەکرد}

هەروەها لە ابن عمر (رضي الله عنه) ئەڵێت: { لَقَدْ عِشْنَا بُرْهَةً مِنْ دَهْرِنَا وَإِنَّ أَحْدَثَنَا يُؤْتَى الْإِيمَانَ قَبْلَ الْقُرْآنِ }
رواه الحاكم بسند صحيح.

هەروەها لە حُذَيْفَةُ (رضي الله عنه) : { إِنَّا قَوْمٌ أُوتِينَا الْإِيمَانَ قَبْلَ أَنْ نُؤْتَى الْقُرْآنَ }
رواه البيهقي و سعيد بن منصور في سننه.
وە بەداخەوە ئێستا قورئان فێر دەكرێن هەتا ئەمرن نازانن ئیمان چییە!!

*ئێستا کە زانیمان گرنگی تەوحید و پێگەی چییە کەواتا با بزانین تەوحید چییە و پێناسەی بکەین:*

**پێناسەی تەوحید لە شەرعدا:** بەتاکدانانی الله تعالی -یە لەوەی کە تایبەتی خۆیەتی لە پەروەردگارێتی، و پەرستراوییەتی ، وناو وسیفاتەکانیدا.
یاخود بریتیە لە: زانستێک کە بەهۆیەوە بیروباوەڕی ئیسلام فێردەبین لە بەڵگە جێگیرەکانەوە.
هەروەها زانستی تەوحید چەند ناوێکی تریشی بۆ بەکار دەهێنرێت لەوانە: {الْعَقِيدَة، والإِيمَان، والسُّنَّة، وأُصُولُ الدِّين، والشَّرِيعَة}.
هەر بۆیە ڕەحمەتی پەروەردگارت لێ بێت واجبترین ولەپێشترین وبەسوودترین وگرنگترینی زانستە شەرعیەکان (تەوحید)ە کە بناغەی ئیسلامە.

## سەرەتایەک بۆ فێربوونی تەوحید

**تەوحید چیە؟**
**شێخ محمدی کوری عبدالوهاب لە پێناسەی تەوحید دەفەرمووێت:**
{هو إفراد الله بما يختص به من الربوبية والألوهية والأسماء والصفات }
واتە: بریتیە لە بە تاک زانینی الله ﷻ لە هەموو شتێک کە تایبەتە بە ذاتی بەرزی و شایەن بە ذاتی پاکییەتی لە پەروەردگارێتی، و پەرستراوییەتی ، وناو وسیفاتەکانیدا.
کە بریتییە لە:
**{پەرستنی الله ﷻ بەتەنها}**
کە ئەوەیی تایبەتە بە تەوحیدی الله ﷻ سێ شتە:
**1- عیبادەتەکان.**
وەک مەزنی و خۆشەویستی و زەلیلی ملکەچ بوون و هانا بردن.
**2- پەروەردگاریەتی.**
وەک دروستکردن و بەخشین و ڕزق و ڕۆزی و بەرێوەبردن و ژیان و مردن.
**3- جێگیرکردنی_سیفاتە_بەرزو تەواوەکانی الله ﷻ کە تەنها تایبەتە بەو وە پاک ڕاگرتنی لەهەموو کەم و کوڕیەک.**
مەبەست لێرە جۆرەکانیەتی، إن شاء الله تعالی بە ووردی باسی دەکەین و ئاماژەی پێ دەدەین.
کەسێک پرسیار دەکات، ئایا وشەی تەوحید لە قورئان وفەرمووده وهاتووە؟
- الله ﷻ لە سورەتی البقرة ئایەتی١٦٣ دەفەرمووێت: ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ { البقرة ١٦٣}
واتا: پەرستراو و خوای ئێوە یەک خوایەکە.

{و سبب نزول هذة الأية أن الكفار قريش قالوا يا محمد صف لنا ربك وانسبه فأنزل الله تعالى هذة الأية}
واتە. هۆكاری دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە بوو كە كافرەكانی قوڕەیش وتیان ئەی محمد وەسفی پەروەردگاری خۆت بكە بۆمان و ڕەچەڵەكەیشی دیاری بكە جا الله تعالی ئەم ئایەتی دابەزاند.

هەروەها الله ﷻ لە {سورة الانعام ١٩} دەفەرمووێت:
﴿قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾
واتا: بەڵكو پێیان بڵێ خوای گەورە تەنها پەرستراوی حەقە و تاك و تەنهایەو هەر ئەو شایەنی پەرستنەو جگە لەو پەرستراوێكی تری بە حەق نییە كە شایەنی پەرستن بێت.
﴿ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ ﴾ {الانعام ٧٨}
وە من بەریم لەو شەریكانەی كە بۆ خوای گەورە بڕیارتانداوە كە وەكو خوا دەیانپەرستن.
پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە عمری كوری خەتاب (رضي الله عنه) فەرمووی.
{ئەگەر باوكت دانی بە تەوحید بنایە تۆش ڕۆژو وخێرت بۆ بكردایە ئەوە سوودی دەبو بۆی} رواه احمد.

## كەواتا با بزانین بۆ چی تەوحید گرنگە ؟

ئەی موسوڵمانی ئازیز ،دوای ئەوەی وشەی تەوحیدمان كرد ڕوونمانكردەوە، بێگومان دەبێت بزانین ئەم وشەیە كە {تەوحیدە } گرنگیەكەی چییە وە مرۆڤ چ قازانجێك دەكات لەم وشەیە بە چەند خالێك بۆ ئێوەی خۆشەویستی روون دەكەینەوە:

### یەكەم

ئەم زانستە كە تەوحیدە زۆر گرنگە چونكە مرۆڤ كاتێك تەوحیدی نەبوو ئەوا هیچ شتێكی لێ قبوڵ نابێت ئەگەر چی زۆریش عیبادەت بكات.
عیبادەتەكانیش وەك {نوێژ، و ڕۆژو ،و زەكات،و حەج}
چونكە یەكەم شت كە فەرمانی پێكرا تەوحید بوو پێش نوێژو ڕۆژو و حەج.

بەڵگەشمان ئەو فەرموودەیە
عن ابن عباس قال.. لما بعث النبي صلى الله عليه وسلم معاذ بن جبل الى نحو الي اليمن قال له. ( انك تقدم على قوم من اهل الكتاب فليكن اول ما تدعوهم الى ان يوحدوا الله تعالى فإذا عرفوا ذلك، فأخبرهم أن الله قد فرض عليهم خمس صلوات في يومهم وليلتهم فإذا فعلوا فأخبرهم أن الله قد فرض عليهم زكاة تؤخذ من أموالهم فترد على فقرائهم فإذا أطاعوا بها فخذ منهم وتوق كرائم أموال الناس)
واتە: عبداللە ی كوری عباس ئەفەرموویت كاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) معاذی كوری جەبەلی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو {تۆ دەیچیت بۆ لای قەومێك كە ئەهلی

کیتابن{ کیتابیان لەلایەن اللە بۆ دابەزیوە وەکو جولەکەکان} یەکەم شت بانگەشەیان بکەیت بۆی ئەوە بێت کە اللە بەتەنها بزانن و بیپەرستن .ئەگەر ئەوەیان کرد یان قبوڵیان کرد هەواڵیان پێبدە کە اللە ﷻ پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوونە لەشەو و ڕۆژەکانیدا ئەگەر نوێژیان کرد هەواڵیان پێبدە کە اللە ﷻ زەکاتی لەسەر فەرزکردوون لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت دەدرێتە هەژارەکانیان جا ئەگەر دانیان بەوەدانا قبوڵیان کرد لێیان وەرگرە وە خۆت بپارێزە لەوەی سامانە بەنرخەکانی خەڵکی وەرگری.

## دووەم

جا ئەگەر سەرنج بدەینە فەرموودەکەی سەرەوە ئەبینین یەکەم شت کە فەرمانی پێکرابیت بریتیە لە بە تاک پەرستنی وەتەنیا زانینی اللە ﷻ پێش ئەوەی باسی نوێژ و ڕۆژو و حەج و زەکات بکرێت باسی تەوحید کراوە.
لە معاذی کوری جبل (رضي اللە عنە) ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی:
{ئایە ئەزانی مافی اللە ﷻ بەسەر بەندەوە چیە؟
معاذ فەرمووی اللە و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی ئەوەیە بەجوانی بپەرسترێت هیچ هاوبەشی بۆ بریاڕ نەدرێت ،فەرمووی ئایە ئەزانی مافیان چییە بەسەریەوە؟ [*مافی بەندەکان چییە بەسەر اللە ؟] دیسان وتی اللە و پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی مافیان بەسەر اللە ﷻ ئەوەیە کە هیچ سزایەکیان نەدات} {صحیح اخرجە مسلم}
کەواتە لیرە بۆمان ڕوون بۆوە کە پەرستنی اللە ﷻ بە تاک تەنها مافی اللە یە دەبێ بە تاک و تەنهایی بپەرسترێت.

## سێیەم

لە عبداللە یی کوری عەمرو رەزای خوای لەسەر بیت لە پێغەمبەرەوە صلی اللە علیە وسلم ئەگێڕێتەوە کە ( بانگی پیاویک ئەکرێت لە سەرانی خەڵک لە ڕۆژی قیامەت ئینجا 99 دەفتەری بۆ پان ئەکرێتەوە هەر دەفتەرێک بەقەد بینینی چاوەکان درێژە دواتر خوای پەروەردگار پێی دەفەرمووێت ئایە ئینکاری هیچ شتێک لەمە دەکەین؟
دەڵێت نەخێر ئەی پەروەردگار، پاشان خوای پەروەردگار دەفەرمووێت ئایە هیچ عوزرو بیانویەک یاخود چاکەیەکت هەیە؟
پیاوەکە دەترسێت دەڵێت نەخێر ئەی پەروەردگارا.
لەو کاتەدا اللە تعالی دەفەرمووێت نەخێر، بەڵکو تۆ لای ئێمە هەندێ چاکەت هەیە هەروەها ئەمرۆ هیچ زوڵم و ستەمێک لەسەرت نییە جا کارتێکی بۆ دەردەهێنرێت تیایدا نوسراوە {أشهد ان لا إلا إله اللە و أن محمدا عبده ورسوله} ..
پیاوەکە دەڵێت ئەی خوایە ئەوە چیە؟
لەگەڵ ئەم دەفتەرانە دەفەرمویێت تۆ ستەمت لێناکرێت. پاشان ، دەفتەرەکان دەخرێنە سەر

لاییەکی تەرازوو کارتەکەش دەخرێتە سەر لایەك، لە ئەنجامدا دەفتەرەکان سووک و کەم دەبنەوە کارتەکەش قورس و گران دەبێت.) {روا الحاكم فی مستدرکە.}

بۆیە بزانە اللە لێت خۆشبێت، ئەمەش پاداشتی تەوحیدە بۆیە ئاگاداری تەوحیدەکەت بە ئەی موسوڵمانی ئازیز.
قال الإمامُ المُجدد شيخُ الإسلام محمد بن عبدالوهاب في كتابه المُفيد؛ كتاب "التوحيد الذي هو حقُّ الله على العبيد":
التوحيد :حق الله على العباد.
تەوحید مافی خوای گەورەیە بەسەر بەندەکانیەوە
وقول الله تعالى:﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾[الذاريات:56].
ئەی موسوڵمانی ئازیز، سەرنجت دەخەمە سەر ئەم ئایەتە پیرۆزەی اللە تعالی کە دەفەرمووێت:﴿ولقد بعثنا في كل امة رسولا﴾ واتا: بەڕاستی بۆناو هەموو ئوممەت و نەتەوەیەك لەهەموو سەردەمێکدا پەیامبەرێکمان ناردووە،
﴿أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت﴾ واتا: بۆ ئەوەی پێیان بڵێ کە تەنها خوا بپەرستن و، لە(طاغوت) و یاسا پوچەڵەکانی بە دووربن.
لێرەدا خوای پەروەردگار دوو خاڵی زۆر گرنگی باس کردووە لەم ئایەتە پیرۆزە : (پەرستنی اللە بە تاک و تەنها، و وەلانانی طاغوت و دوور کەوتنەوە لێی ).
کەهەر پێغەمبەرەێک لەگەڵ ئوممەتەکەی خۆیدا لەسەرەتادا بانگەشەی ئەم دوو خاڵە گەوهەرییەی کردووە کە بناغەی دینی ئیسلامە.
وە اللە جل وعلا لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحی إليه أنه لا إله إلا أنا فاعبدون﴾ واتا: بەراستی لە پێشی تۆ ئەی محمد صلى الله عليه وسلم چی پێغەمبەرێکمان ناردووە ئیللا وەحیمان بۆ ناردووە کە هیچ خوایەک نییە جگە لە من وتەنها من بپەرستن.
سەرنج: موسوڵمانی ئازیز لێرەدا وشەی (فاعبدون) واتا (لیوحیدون) واتا بەر قەرارکردنی تەوحید و پەرستنی اللە بە تەوحیدەوە.

## جۆرەکانی یەکخواپەرستی {تەوحید}

- **توحید الربوبیة: واتە پەرستنی اللە تعالی لە پەروەردگاریەتدا.**
- **توحید الالوهیة: واتە بەتەنها پەرستنی اللە تعالی لە پەرستندا.**
- **توحید الاسماء و الصفات: واتە بە تەنها اللە پەرستی لە ناو و سیفەتەکانی**

با بێین جوانتر لە هەرسێ جۆرەکەی تێرابمێنین و روونی بکەینەوە:

١. **بەتەنها اللە پەرستی لە پەروەردگارییەتی(توحید الربوبیة):** واتا باوەرت وابێ تەنها اللە ﷻ ئەتژێنێت و ئەتمرێنێت و رزقت دەدا و دروستکەری هەموو شتێکە، هەر وەک اللە تعالی دەفەرمووێت: {ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيل ﴾ {الزمر : ٦٢}.

{الله خلق كل شئ} واتا: بەڕاستی خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە {وهو على كل شئ وكيل} واتا: هەر ئەو بە هەموو شتێکدا ڕادەگاو توانای هەموو شتێکی هەیە، خۆی سەرپەرشتیکاری هەموو شتێك دەکا چۆن حیکمەتی بیخوازێت.

**٢. بەتەنها اللّٰه پەرستی لە پەرستندا (توحيد الالوهية):**
ئەوەیە کە عیبادەتەکان تەنها بۆ اللّٰه ﷻ بکەیت، بۆ هیچ ڕێبازێک و هیچ قەبر و کەسێک یاخود تاغوتێک نەیکەیت .
اللّٰه تعالی دەفەرمووێت:
{قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ } (الأنعام ١٦٢)
واتا: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەی ئیماندار بڵێ بەڕاستی نوێژو حەج و دروشمەکانی و (سەرجەم چاکە و بەندایەتیم) هەروەها ژیان و مردنم تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانەوە.

**٣. بە تەنها اللّٰه پەرستی لە ناو و سیفاتەکانی اللّٰه ﷻ (اسماء الوصفات):** واتا باوەڕت بە هەموو ناوو سیفاتەکانی اللّٰه ﷻ بەو لێکدانەوەیەی کە لە قورئان و سونەت هاتووە...
هەروەک اللّٰه ﷻ فەرموویەتی: {وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ } { المائده ٦٤}
گاورەکان(یەهودییەکان) ووتیان خوا دەستی بەستراوە!: {وقالت اليهود يدالله مغلولة}: (فەنحاس)ی یەهودیی نەفام و نەزان گوتی: خوا دەستی زنجیرکراوەو بەستراوە، بۆیە وا ڕژدو چروکەو، ڕزق و ڕۆزیی بە بەندەکانی خۆی نادا! ...
لە وەڵامی ئەم نەفامەدا، اللّٰه دەفەرموێت:{غلت أيديهم} دەك دەستی ئەوان کەلەبچەو ئیفلیج بێ و، شەلەل لێی بداو، هەرئەوانیشن ڕژدو چرووکن، پاشان اللّٰه نەفرینیان لێ دەکا و دەفەرمووێت: {ولعنوا بما قالوا} وە لەبەر ئەو قسەشیان، نەفرینی خوایان لێکرا، بۆیە بەردەوام چکووس و بەخیلن {بل يداه مبسوطتان} نەخێر دەستی خوا نەبەسراوە، وەکو ئەوان دەڵێن، بەڵکو هەردوو دەستی خوا هەمیشەو بەردەوام والاو گوشادن
وە فەرموویەتی: {وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا} {الاعراف ١٨٠}
واتە: خوای گەورە ناوە جوانەکانی هەیە تۆ بەو ناوە جوانانەوە لە خوا بپاڕێرەوەو بڵێ: یا رحمن یارحیم یا کریم یا عزیز، وە تەوەسولی پێ بکەوبڵێ: خوایە بۆ خاتری ناوە جوانەکانت، (هەرکەسێك نەوەدو نۆ لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە لەبەر بکات و لێی تێبگات و لە خۆیدا جێبەجێی بکات ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە، وە ژمارەی ناوەکانی خوای گەورە کەس نایزانێت تەنها خۆی نەبێت چونکە هەندێك ناوی هەیە لە هیچ کتابێکی ئاسمانی داینەبەزاندووەو بە هیچ پێغەمبەرێکیشی نەووتووەو لای خۆی هێشتوویەتیوە).

برایان و خوشکانی موسوڵمان سوپاس بۆ خوا تەوحیدمان روونکردەوە و باسمان کرد کەوا زانیمان چییە؟ و گرنگی چییە؟ ئێستاش باسی شرک دەکەین کەوا چییە؟ و مەترسی چییە لەسەر مرۆڤ گەر ئەنجامی بدات؟ :

**{الشرك وهو ضد التوحيد}**

**واتە: شیرک پێچەوانەی یەکخواپەرستیە**

**جۆرەکانی هاوبەشی دانان [الشرك} دەبێتە سێ جۆر**

**شیرکی گەورە، شیرکی بچووک، شیرکی شاراوە**

شیرک لەتاوانە گەورەو مەترسیدارەکانە (كبائر الذنوب) لەشەریعەتی خوای پەروەردگار.

قال تعالی :﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ ما دُونَ ذلِكَ لِمَنْ يَشاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرى إِثْماً عَظِيماً﴾{النساء ٤٨}

واتە: خوای گەورە تەنها لە هاوبەش بڕیاردان خۆش نابێت

[إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ] بە دڵنیایی خوای گەورە هەرگیز خۆش نابێ لە كەسێك كە شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار بدات و لەسەر شیرك بمرێ و تەوبە نەكات [وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ] وە جگە لە شەریك دانان بۆ خوای گەورە چەندێك مرۆڤ تاوانی گەورەی هەبێ ئەوە ئەكەوێتە بەر ویست و مەشیئەتی خوای گەورە, خوای گەورە ویستی لێ بێت لێی خۆش ئەبێت بە فەزڵی خۆی، وە ویستی لێ بێت سزای ئەدات بە دادپەروەری خۆی، بەڵام بەهەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا نامێنێتەوە [وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا (48)] وە هەر كەسێك شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار بدات ئەوە بەدڵنیایی درۆو بوهتان و تاوانێكی یەكجار گەورەی بۆ خوای گەورە هەڵبەستووە .

**شیرکی گەورە:** وەک ئەوەی هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیار بدەی، واتە شتێکی تر یان کەسێکی تر بپەرستیت جگە لە زاتی اللّٰه وبیکەیت بەهاوتای پەنا بەخوای پەروەردگار. وەک پەرستنی بت، دار،بەرد، ئەستێرە ، ئاژەڵ پادشایەکی دونیا ، سەرکردەیەک ، پێغەمبەرێک... کەسەکە لە ئیسلام دەردەچێت و خاوەنی هەمیشەی دۆزەخ دەبێ، هەروەها هەموو کارو کردەوەکانی مایە پوچ دەبن هەرگیز لە لە دڵێکدا لەگەڵ ئیمان کۆنابێتەوە کەسێک کوفری گەورە بکات تاوانەکەی یان سزاکەی کوشتنە لەلایەن دەسەڵاتدارانی وڵات، دەبێت وڵاتەکە وڵاتێک بێت تەواو ئیسلام بێت حوکمی ئیسلامی تێدا بەرقەرار بیت و گەر تۆبەی کرد لێ دەبوورێ ماڵ و خوێنی پارێزراو دەبێت.

شیرکی گەورە چوار جۆری هەیە

- **شیرکی دوعاکردن {الدعوة} بانگکردنی کەسێکی تر لەگەڵ اللّٰه ﷻ.**

دوعا کردن چونکە خۆە گەورەترین عیبادەتە وە خوودی دوعاکردن عیبادەتە هەرکاتێک دوعات کرد بۆ غەیری اللّٰه ﷻ ئەوە شرکت ئەنجام داوە وەک داواکردن لە قەبرێک یان پغەمبەرێک یان

پیاوچاکێک . بەڵگە، قال تعالى: ﴿وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ ۚ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ ﴾ {المؤمنون ١١٧}
واتا : ئەو کەسەی خوایەکی تر بڕیار بدات و بیکاتە شریکی اللە ﷻ ، لە کاتێکدا هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نییە ، ئەوە بەڕاستی حساب و لێپرسینەوەکەی لای پەروەردگاریێتی ، بێ گومان بێباوەڕ و خوا نەناسان سەرفراز نابن.

- **شیرکی نیەت و ویست و مەبەست {النية ، الارادة ، قصد}:**

ئەمش ئەوەیە کە تۆ نیەت و مەبەستت بۆ خودای گەورە نەبیت، واتا کاتێک کارێك دەکەیت نیەتت بۆ خودای گەورە نەبێت لە کار و کردەوەکانت. نابێت کارێک بکەی بۆ کەسێک وەک ئەوەی کە ئیعجابی بکەی بلێت هەتا ئەو کەسە بە دلی بێت واتا کارەکە بۆ ڕازی کردنی کەسەکەیە نەک بۆ ڕازی کردنی خودای گەورە.

- **شیرکی خۆشەویستی {المحبة]:**

واتا کەسێکت خۆشبویت ئەوەندت خۆشبویت وەک بلێیت یەکسانی بکەی بە خۆشەویستی خودای گەورە، واتە ئەگەر ئەو کەسە هەرچی پێ بلێ ئەی کات جا باش بێت یان خراپ کارەکە ئەوندەی کەسەکە خۆشدەوێت هەموو شتێکی بە گوێ دەکات ئەوەش لەناو ئەو کەسانە باوە کە عاشقن کە ئەو کەسە هەموو دلی داگیرکردووە و خودای گەورەی لەبیر کردووە. هەروەک اللە تعالی دەفەرموێت: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ ۖ}
واتە: [وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَادًا] لەناو خەڵكیدا کەسانێك هەن جگە لە خوای گەورە ئەکەنە شەریك و هاوشێوە بۆ خوای گەورە [يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ] ئەو شەریکانەیان خۆش ئەوێ وەکو خۆشەویستی خوا, چەندێك خوای گەورەیان خۆش ئەوێ ئەوانیشیان بەئەندازەی خوای گەورە خۆش ئەوێ، یاخود بتەکانیان خۆش ئەوێ بەئەندازەی ئەوەی کە ئیمانداران خوایان خۆش ئەوێ [وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ] بەڵام باوەڕداران خوای گەورەیان لەوان خۆشتر ئەوێ،یان ئیمانداران خوای گەورەیان زیاتر خۆش ئەوێ لە خۆشەویستی ئەوان بۆ بتەکانیان ئەو دوو تەفسیرەی هەیە [وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُوا إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا] ئای ئەو ستەمکارانە کە کەسانێکیان کردووە بە شەریك و وەکو خوای گەورە خۆشیانیان ئەوێ کاتێك کە لە ڕۆژی قیامەت سزای خوای گەورە ئەبینن ئەو کاتە ئەزانن کە هێزو توانا تەنها بۆ خوای گەورەیەو خوایەکانی ئەوان بێ دەسەڵاتن و ناتوانن سزای خوای گەورەیان لەسەر لابدەن [وَأَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ (165)] وە سزای خوای گەورە یەکجار سەختە.

- **شیرکی گوێڕاڵیکردن {الطاعة}** بە قسەکردن و گوێڕایەلی کردن وەکو ئەوەی چۆن بە قسەی اللە ﷻ دەکات زیاتر بە قسەی فڵان و فیسار دەکات زیاتر فەرمانەکانی بەندە(عبد) جێبەجێ دەکات ئەگەر ئەو فەرمانەی ئەو دەریدەکات پێچەوانەی فەرمانەکانی اللە ﷻ ش بیت ئەوا بە گوێی دەکات و گوێڕایەلی دەکا واتا فەرمانەکانی اللە ﷻ پشت گوێ دەخات وە

ئەگەر حەڵاڵیان بۆ حەرام کرد و حەرامیان بۆ حەڵاڵ کرد ئەمیش گوێڕایەلیان بوو ئەوە شیرکی گەورەیە.

قال تعالى: ﴿ المص{١} كِتَابٌ أُنْزِلَ إِلَيْكَ فَلَا يَكُنْ فِي صَدْرِكَ حَرَجٌ مِنْهُ لِتُنْذِرَ بِهِ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ {٢}اتَّبِعُوامَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ وَلَا تَتَّبِعُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ﴾ {الاعراف ١_٣}
واتا : سەرەنچی سەرەتای سورەتی البقره بکە، ئەم قورئانە کتێبێکە بۆ هاتۆتە خوارەوە کەواتە با سەغلەتی لە دڵ و دەروونت نەبێت ، بۆ ئەوەی خەلکی پێ بێداربکەیتەوە وە هەروەها یادەوەریشە بۆ ئیمانداران ، خەڵکینە شوێن ئەوبەرنامە بکەون کە پەروەردگاتانەوە بۆتان هێنراوە خوارەوە ، جگە لەو زاتە شوینی هیچ لە پشتیوان و خۆشەویستێکی تر مەکەون ،کەم یاداوەری وپەند وەردەگرن بیردەکەنەوە .

موسوڵمانی ئازیز ئەمەی تا ئێستا باسمان کرد شیرکی گەورە و جۆرەکانی بوون ،ئێستا باسی شیرکی بچووک دەکەین:

**شیرکی بچووک :** شیرکی بچووك بریتیە لە {الرياء} واتە کارێک بکەیت بۆ ناوبانگ و خۆ دەرخستن.

خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرناچێ بەڵام ئەگەر هەر بەردەوام بێت لەسەر ئەوە، کافر دەبێت واتە ئەگەر کار وکردەوەکانی وەک نوێژ و حەج و زەکات بکەی بۆ ئەوەی بڵێن کەسێ چاکە ئەوا شیرکە ، واتا چاکەیەک دەکا هەتا بڵێن پیاوی چاکە یان نوێژ دەکات و یان ئافرەتی چاکە حیجاب دەکات بۆ ئەوەی کەسێک لێ ڕازی بێت.
هەروەها رسول الله ﷺ دەفەرمووێت ئاگاداری شرکی بچووک بن... وتیان یا رسول الله شیرکی بچووک چیە؟
فەرمووی :الرياء....

**شیرکی شاراوە :** بریتیە لە شیرکی شاراوە : وەک ئەوەی خەمی دونیا و خەمی دونیا دڵی پڕکردوون وشە جوان و ئارەزووەکانت زاڵ بووە بەسەرتدا و خوای گەورەت لەبیر نەبێت نەزانی بۆ چی دروست بووی، بە بەڵگەی فەرموودەی پێغمبەرمان ﷺ { شیرک لەم ئومەتەدا زۆر شاراوەترە لە ڕۆشتنی مێرووڵەی ڕەش لەسەر بەردێکی ڕەش لەشەوێکی تاریک و شەوەزەنگدا.
أبو بكر الصديق (ڕەزای خوای لێ بێت) بەپێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموو : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەفارەتەکەی ئەو چییە؟
فەرمووی :**{أن تقول: اللهم إنى أعوذ بك أن أشرك بك شيئاً وأنا أعلم، وأستغفرك لما لا أعلم}**
واتا // (کەفارەتەکەی ئەوەیە) بڵێیت : خودایە پەنات پێدەگرم لەوەی کە هاوەڵت بۆ بریار بدەم و ئاگاداریش بم لێی، وە داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەم لەوەی کە بێ ئاگام لێی ونایزانم.

## کوفر و جۆرەکانی

کوفر لە ڕووی زمانەوەنیدا {شاردنەوە }
لە ڕووی اصطلاح بەمانای {شاردنەوەی حەقە کە تەوحید}

**کوفر دوو جۆرە :- کوفری گەورە کوفری بچووک**

### کوفری گەورە:

واتا لە ئیسلام دەردەچێت، وە خاوەنەکەی گەر تۆبە نەکات ئەوا کافرە و بۆ هەتا تایە لە دۆزەخدا دەبێت پەنا بەخوای پەروەردگار.
**حوکمەکەی**: گەر تۆبە نەکات لە وڵاتی موسلمانان بێت، کافر ئەبێ بکوژرێ لەلایەن وەلی ئەمری دەوڵەتەوە ، گەر تۆبەی کرد ئەوا خوێنی و مالی پارێزراوە وە لە ئاخیرەت گەرتەوبەی نەکردبێ بەڕاستی ئەوا خوای گەورە لێی خۆشنابێ تا هەتا هەتایە لە دۆزەخە بەڵام ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا خوای گەورە لێ خۆش دەبێ.

- کوفری بە قسە و بە کردار { قول و عمل}
- کوفری بە قسە : واتا :بە زوبان وەک وتنی قسەیەکی کوفری
- کوفری بە کردار { عمل } واتا : بە کردنی یان ئەنجامدانی کارێکی کوفری کە بە جەستە ئەنجامی بدە،

کوفری گەورە پێنج جۆرە :-

- **کوفری بە درۆخستنەوە { کفر التکذیب}**

ئەم جۆرە کوفرە جارێکیان بە دڵ و جارێکیان بە کردەوە و وە زمان وەیان حەڵاڵ یان حەرام کردن.
﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴾
{الأنعام ٣٣ }
واتا: بەڕاستە ئیمە دەزانین کە بێگومان ئەوەی کە ئەوان دەیڵێن غەمبارت دەکات بەڵام بێگومان ئەوان تۆ بە درۆزن دانانێن بەڵکو ئەو ستەم کارانە ئایەتەکانی اللە ﷻ ئینکار دەکەن

- **کوفری لووتبەرزی {کفر الإستکبار }**

وەک کوفری شیطان کاتێک اللە تعالى فەرمانی پێ کرد سوجدە بۆ ئادەم بەرێ بەڵام استکباری کرد. قال تعالى: {وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾ {البقرە ٣٤ }

واتا : [وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ] پەروەردگار ئەمری کرد بە فریشتەکان کە کڕنۆشی ڕێزو ئیحترام بۆ ئادەم بەرن کە لە شەریعەتی خۆماندا حەرام کراوە ئەم شتە تایبەت بووە بەوانەوە [فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ (34)] هەموویان سوجدەیان بۆ برد تەنها ئیبلیس نەبێ کە لە جن بوو بەڵام زۆر خواپەرست و چاکەکار بوو لەناو مەلائیکەتەکاندا بوو ئەم سوجدەی نەبردو ڕەفزی کردو ڕەتی کردەوەو خۆی بە گەورە زانی و وتی من لەو باشترم من لە ئاگر دروستکراوم و ئەو لە قوڕ، وە لە زانیاری خوای گەورە هەبوو کە ئەمە کافر دەرئەچێ وە کافر بوو .

• **کوفری وازهێنان و لادان {الإعراض }**

وەک وازهێنان لە حەق و کارنەکردنی جا ئەگەر بە دڵ بێت یان بە زمان یان بە کردەوە ﴿مَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ ﴾ { الاحقاف ٣}

واتا : [مَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُسَمًّى] ئێمە ئاسمانەکان و زەویەکان و ئەوەی لە نێوانیاندا هەیە دروستمان نەکردووە ئیللا بە حەق نەبێت، بێهودەو بێ حیکمەت نییە، وە تا کاتی دیاریکراوی خۆیان کە ڕۆژی قیامەتە [وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنْذِرُوا مُعْرِضُونَ (3)] وە کافران و بێباوەڕان لەو ئاگادارکردنەوەو ترساندنەی کە کراون لە قورئانی پیرۆزدا ئەوان پشتی تێ ئەکەن.

• **کوفری گومان {الشک}** :وەک ئەوەی دوودڵ بێت لە شوێنکەوتنی حەق یان دوودڵ بێت لەو شتەی کە حەقە، چونکە ئەوەی داواکراوە بریتیە لەوەی یەقینی تەواوت هەبێت بە رسول الله ﷺ وە ئەوەی کە هێناویەتی وە نموونە بۆ ئەم جۆرە کوفرە بەسەرهاتەکەی سورەتی الکهف دەخەینە ڕوو:

﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ قَالَ مَا أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِ أَبَدًا ﴾ { الکهف ٣٥ }

واتا : [وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ] وە چووە ناو باخەکەی خۆی و موسڵمانەکەیشی بردە ناوی و نیشانیدا کە ئەو زوڵمی لە خۆی ئەکرد بە کوفر کردن و لووتبەرزی [قَالَ مَا أَظُنُّ أَنْ تَبِيدَ هَذِهِ أَبَدًا (35)] وتی: گومان نابەم ئەم باخ و باخاتە لەناو بچێت و بۆ هەمیشەیی ئەمێنێتەوە.

﴿ وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴾ {الکهف ٣٦}

واتا: [وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً] وە گومان نابەم کە قیامەت هەبێ و لە دوای مردن زیندوو بینەوە [وَلَئِنْ رُدِدْتُ إِلَى رَبِّي] وە ئەگەر زیندوو بوونەوەش هەبێ وا دابنێین کە بگەڕێمەوە بۆ لای خوای گەورە [لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِنْهَا مُنْقَلَبًا (36)] ئەوە لە دونیا باشترم دەست ئەکەوێ .

﴿ قالَ لَهُ صاحِبُهُ وَهُوَ يُحاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِنْ تُرابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلاً﴾
{الكهف ٣٧ }
واتا : [قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ] هاوڕێ باوەڕدارەکەی گفتوگۆی لەگەڵدا کردو پێی وت: [أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِنْ تُرَابٍ] ئایا تۆ کوفرت کرد بەو خوایەی کە تۆی لە خۆڵ دروست کردووە واتە: ئادەمی باوکت [ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ] پاشان خۆتی لە دڵۆپە ئاوێك لە مەنی دروست کردووە [ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلًا (37)] پاشان کردوتی بەم مرۆڤە ڕێکە هەموو ئەندامەکانتی بە ڕێکی دروست کردووە .

﴿ لَٰكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَدًا ﴾ {الكهف ٣٥_٣٨ }
واتا: [لَكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَدًا (38)] بەڵام الله پەروەردگاری منە وە هیچ کەسێك ناکەمە شەریکی پەروەردگارم .

سەرنج: لێرەدا گومانی برد بەوەی کەوا ئەو موڵکەی هەیەتی هەرگیز لەناو ناچێت، پاشان گومانێکی لەوە خراپتری برد کە گووتی قیامەت بەرپا نابێت.

- **کوفری دووڕوویی {النفاق}**

ئەوەیە کە بەدڵ و کردەوە بڕوای پێی نیە بەڵام بە ڕووکەش وا دەردەخات کە بڕوای پێی هەیە. قال تعالى: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ﴾ { البقرة ٨} .
واتا :لە ناو خەڵکیدا کەسانیک هەن کە دەڵێن ئیمان و باوەڕمان بە خوا و بە ڕۆژی قیامەت هیناوە . لەڕاستیدا ئەوان دڕۆ دەکەن ئەوانە باوەڕدار نین.
﴿ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنفُسَهُمْ وَمَايَشْعُرُونَ﴾ {البقرة ٩}
واتا : بە خەیاڵی خۆیان وادەزانن خودا و ئەو کەسانە هەڵدەخەڵەیێنن کە باوەرداری ڕاسەقینەنن، کەچی جگە لە خۆیان کەسیان پێ هەڵناخەڵەتێت بەڵام هەست ناکەن وتێناگەن و بیرناکەنەوە.
﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ﴾ {البقرة ١٠}
واتا : وانەی لە دڵ و دەروونیان نەخۆشی بێ باوەڕی و حەسوودی و کین هەیە ، خواش دەردیان گران و گاریگەر دەکات و سزایەکی سەختیش لە دنیا و قیامەت چاوەڕێیانە بەهۆی درۆکردن و دژایەتیان بۆ ئیسلام .
﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾ {البقرة ١١}
واتا : ئەوانەی پێیان گووترا تۆوی گوناهـ و تاوان مەچەێنن لە زەویدا ، دەڵێن بەڕاستی ئێمە تەنها چاکسازی دەکەین.

﴿أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ﴾ {البقرة ١٢}
واتا : ئاگادار بن کە بەڕاستی هەر ئەوانەن تۆوی خراپە دەچێنن بەڵام بەهۆی لووتبەرزی و دەردارییانەوە هەستی پێ ناکن و خۆیان لە گێلی دەدەن.

**کوفری بچووک :** ئەنجامدەری ئەم جۆرە لە ئیسلام دەرناچێت بەڵام لە سەرووی گوناهە گەورەکانە و سزای توندی لەسەرە گەر تۆبەی لەسەر نەکات وە دەبێتە هۆی لاوازە ئیمان .

جۆرەکانی کوفری بچووک

- **کوفری نیعمەت** : ﴿ يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ ﴾ {النحل ٨٣}

واتا : نیعمەت و بەخششی خودا دەناسن ، پاشانیش نكوڵی لێ دەكەن زۆربەشیان بێ باوەڕن .

- **سوێند خواردن بە غەیر خودا** : { من حلف بغير اللا فقد اشرك }

واتا : رسول الله فەرموویەتی ﷺ هەرکەسێک سوێند بە غەیری خودا بخوات ئەوە شیرکی کردووە.

- **کووشتنی موسڵمان بە ناحەق** : {سباب المسلم فسوق وقتاله كفر }

واتا ؛ جنێودان بە موسڵمان فیسقە ، وە کووشتنی کوفرە (کوفری بچووک).

- **نسبەت کردن بۆ غەیری باوک :**

﴿ لَا تَرْغَبُوا عن آبَائِكُمْ، فمَن رَغِبَ عن أَبِيهِ فَهو كُفْرٌ ﴾ { صحيح البخاري}

واتا : پشت مەکەن لە باوکتان ، چونکە هەر کەسێک پشت بکات لە باوکی ، خۆی بداتە پاڵ کەسێکیتر ئەوا کوفرە,

**جۆرەکانی دووڕوویی :-**

| | |
|---|---|
| **بیر وباوەڕ { الإعتقادی}** | **کردار { عملي }** |

بیر و باوەڕ { الاعتقاد } شەش جۆرە :-

- **بەدرۆخستنەوەی رسول الله ﷺ**
- **بەدرۆخستنەوەی بەشیک یان نیوەی ئەوەی رسول الله ﷺ هێنای.**
- **ڕق لٌیبوونەوە لە رسول الله ﷺ**
- **ڕق لێبوونەوە لە بەشێک لەوەی کە رسول الله ﷺ هێناویەتی.**
- **ڕق لێ بوونەوە لە سەرکەوتنی دینی رسول الله ﷺ**
- **بە کەمبوونی دینی رسول الله ﷺ**

کردار {عملی } پێنج جۆرە :-

- **کاتێک قسە دەکات درۆ دەکات**
- **ئەگەر دژایەتی یەکێک بکات لە سنوور دەردەچێت**
- **ئەگەر پەیمان بدات دەیشکێنێت**
- **ئەگەر شتێك بە ئامانەت لای دابندرێت خیانەتی لێ دەکات**
- **ئەگەر بەڵێـن بدات پێچەوانەی دەکات**

## پێناسەی تاغووت :-

الطاغوت لغة من طغا وطغي، يطغى ويطغو طغيانا : مجاوزة الحد. وكل ما جاوز حده وقدره فقد طغى وهو طاغ، وطغى البحر هاجت امواجه ومنه قول الله تعالى :-
{إِنَّا لَمَّا طَغَى الْمَاءُ حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ }{ الحاقه ١١}

تەعریفی تاغوت لە شەرعدا

- **ابن تيميه:-**

كە تەعریفی تاغوت دەكات دەڵێت تاغوت لە توغیانەوە هاتووە، توغیانیش لە سنور دەرچوونەوە هاتووە، هەركەسێ كە هەر جۆرە عیبادەتێكی بۆ ئەنجامبدرێت ئەگەر پێی ناخۆش نەبێت ئەوە تاغوتە.
لەبەر ئەمە هەركەسێ لە حوكم ببرێتەوە بۆ لای بەبێ قورئان و سوننەت ئەوە تاغووتە، فیرعەون ناوبراو بە تاغووت. قەومی عادیش ناوبراوە بە تاغوت.

- **ئیمامی محمد بن عبدالوهاب دەڵێت: -**

تاغووت گشت ئەو شتانە دەگرێتەوە عیبادەتیان بۆ ئەنجامدەدرێ جگە لە الله ﷻ

- **ابن بطين: -**

دەڵێت: تاغوت هەموو مەعبودێك دەگرێتەوە جگە لە الله ﷻ وە هەموو سەرێكی گومڕا دەگرێتەوە كە بانگەواز دەكات بۆ باطل و لەبەر چاوی خەڵك جوانی دەكات.
هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە كە خەڵكی دایان ناون بۆ ئەوەی حوكم بكات لە بینیناندا بە حوكمی جاهیلیەت.
هەروەها كاهین وساحیر ... دەگرێتەوە ئەوانەی خەڵك بانگ دەكەن بۆ پەرستنی مردووەكان.

## جۆرەكانی تاغوت و سەركردەكانی: -

**١_ تاغوتی حوكم كردن.**
**٢_ تاغوتی عیبادەت بۆ كراو**
**٣_ تاغوتی تاعەتكردن و شوێنكەوتن.**

تاغوتەكان زۆرن و سەرەكەكانیان پێنجن:

**یەكەمیان: شەیتان كە بانگەوازی دەكا بۆ پەرستنی غەیری الله ﷻ**

: الله ﷻ فەرموویەتی : {أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ ۖ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِين}
{يس ٦٠}

واتا: [أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لَا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ] ئەی ئادەمیزاد ئایا عەهدو بەڵێنم لێ وەرنەگرتن کە ئێوە عیبادەتی شەیتان نەکەن [إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ (60)] لەبەر ئەوەی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە .

شەیتان تاغووتی هەرە گەورەیە، کە بەردەوام هەوڵ دەدات خەڵک لە تاعەتی اللّٰه دووربخاتەوە. زۆربەی ئینسانەکانیش شەریکایەتی شەیتان دەکەن لەوەدا، کە خەڵکی لە پەرستنی اللّٰه لادەدەن ئەوانیش دیسانەوە هەر تاغوتن.

**دووەم:- ئەو حاکمەی حوکمەکەی اللّٰه ﷻ دەگۆڕێت**

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾ {النساء ٦٠}

واتا: [أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ] (ابن عباس) دەفەرمێت: (ئەبو بەرزەی ئەسلەمی) پێش موسڵمان بوونی فاڵچی بوو بڕیاری لە نێوان جولەکەکان دەدا لە کاتی ناکۆکیدا، چەند موسڵمانێکیش چوون بۆ لای، خوای گەورە ئەم سێ ئایەتەی دابەزاند (الصحيح المُسنَد): ئایا نابینی ئەوانەی کە بە گومانی خۆیان ئەڵێن: ئەی محمد صلى الله عليه وسلم ئیمانمان هێناوە بەو قورئانەی کە بۆ تۆ دابەزیوە وە بەو ئەو کتابانەی تریش کە لە پێش تۆدا دابەزیوە لە کاتێکدا کە ئەیانەوێ حوکم و بڕیار بەرن بۆ لای تاغوت و فاڵچییەکان و ئەوانەی کە حوکم بەغەیری قورئانی پیرۆز ئەکەن[وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ] لە کاتێك کە فەرمانیان پێکراوە لە هەموو کتێبە ئاسمانیەکاندا کە کوفر بکەن بەهەموو تاغوتێك [وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا (60)] وە شەیتان ئەیەوێ گومڕایان بکات و لە ڕێگای ڕاست دووریان بخاتەوە گومڕاکردنێکی زۆر دوور.

**سێیەم:- هەرکەسێ کە حوکم بکات بە غەیری ئەوەی کە اللّٰه دایبەزاندووە وبڕیاریداوە.**

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ { المائدة ٤٤ }

قال ابن القيم

"ومن حاكم خصمه إلى غير الله ورسوله فقد حاكم إلى الطاغوت وقد أُمِر أن يكفر به، ولا يكفر العبد بالطاغوت حتى يجعل الحكم لله وحده"

واتا: هەر کەسێک حوکمی بەرێتەوە بۆ غەیری یاسای اللّٰه و پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوا حوکمەکەی طاغووت کردوویەتی لە کاتێکدا ئەو فەرمانی پێ کراوە کە بێ باوەر بێ بە طاغووت، وە بەندە بێ باوەر نابێت بە طاغووت تاوەکو بەرقەراری ئەوە نەکات کە حوکم و یاسا هەر بۆ اللّٰه-یییە.

**چوارەم :کەسێک بانگەشەی ئەوە بکات کە خۆی عیلمی غەیب دەزانێت**
﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ {النمل ٦٥}
واتا: - بڵێ هیچ کەس نییە غەیب بزانێت لە ئاسمانەکان و لە زەوی، جگە لە الله ﷻ ئەوانە نازانن خۆشیان چ کاتێک زیندوو دەکرێنەوە.
﴿وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ﴾ {الانعام ٥٦}
واتا :- کلیلەکانی غەیب تەنها لای خۆیەتی جگە لە خۆی کەسی دیکە نایزانێت.
﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا﴾{ الجن 26 }
واتا:- الله ﷻ هەموو غەیبەکان دەزانێت هیچ کەس ناتوانێت غەیبەکانی ئەو پێ بزانێت.

ئەی موسوڵمانی ئازیز ،لەم ئایەتانەی الله بۆمان روون دەبێتەوە کەوا هەرکەسێ بانگەشەی ئەوە بکات کە خۆی یان هەر کەسێکی دیکە غەیب دەزانێت، ئەوە قورئانی بەدرۆ زانیوە پەنا بەخوا. واجبە لەسەر موسلمان کە خۆی بپارێزێت لەوەی کە بروات بۆ لای ئەوانەی کە بانگەشەی علمی غەیب دەکەن وەک ساحیرەکان، کاهینەکان، وە فاڵگرەوەکان خۆشی لەوە بپارێزێت لە هەر شتێک کە ئەوان دەیڵێن، و باوەریان پێ نەکات. رسول الله صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت: (من أتى عرافاً فسأله عن شيء فصدقه لم تقبل له صلاة أربعين يوماً)
واتا: هەرکەسێ بروات بۆ لای (العراف) فاڵگرەوە و پرسیاری لێ بکات لەبارەی شتێک ئەوا نوێژی چل رۆژی لێ قبول ناکرێت.
هەروەها رسول الله ﷺ دەفەرمووێت: من أتى كاهنا فصدقه بما يقول فقد كفر بما أنزل على محمد ﷺ..
واتا: هەر کەسێ بروات بۆ لای کاهینێک یان هەر عەرافێک باوەر بکات بە هەر چیەک کە دەیڵێت، ئەوە بە تەئکید کافربوو بەوەی الله ﷻ دایبەزاندووە بۆ سەر محمد ﷺ.

کەواتا خوشکان برایان بە تەنها ڕۆیشتن بۆلای ساحیرەکان و کاهینەکان و فاڵگرەوەکان سەبەبە بۆ قبوڵ نەبوونی نوێژ،و عیبادەتەکان.

**پێنجەم : هەر کەسێک کە هەر جۆرە عیبادەتێکی بۆ دەکرێت وەپێی رازی بێت، یان داوا لە خەڵک بکات کە هەرجۆرە عیبادەتێکی بۆ ئەنجام بدەن بۆ غەیری الله ئەوا طاغووتە.**
بەڵگە ئەم ئایەتەیە: ﴿وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾ {الأنبياء ٢٩}
واتا: هەرکەسێک لەوانە بڵێ من ئیلاهم لەگەڵ الله دا ئەوا پاداشتی بە جەهەنەم دەدەینەوە، بەو جۆرە پاداشتی زالمان دەدەینەوە.

## چۆنیەتی کوفرکردن بە تاغوت

**شێخ محمد بن عبدالوهاب دەڵێت:** {صفة الكفر بالطاغوت أو الكفر بما يعبد من غير الله هو أن تتركها، وتغضبها،وتكفر اهلها، وتعاديهم}

وأما معنى الإيمان بالله : فأن تعتقد، أن الله هو الإلَه المعبود وحده، دون من سواه، وتخلص جميع أنواع العبادة كلها لله، وتنفيها عن كل معبود سواه، وتحب أهل الإخلاص، وتواليهم، وتبغض أهل الشرك، وتعاديهم.

واتا: چۆنیەتی کوفرکردن بە تاغوت بەمجۆرەیە کە عەقیدەت وابێت کە عیبادەتی غەیری الله کارێکی پوچە و ناحەقە، وە دەبێت تەرکی بکەیت، و رقت لێ بێتەوە، وە هەرکەسێک ئەهلی تاغوت بێت لایەنگرەکانی) دەبێت بە کافریان بزانیت، لەگەل ئەوەشدا دەبێت دوژمنایەتیان بکەیت.

موسوڵمانی ئازیز لێرەدا الله تعالى نمونەی پێغەمبەر ئیبراهیممان بۆ دەهێنێتەوە و باسی دەکات و دەفەرمووێت:

﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾ {الممتحنة ٤}

واتا: [قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ] بە دڵنیایی لە ئیبراهیم صلى الله عليه وسلم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون ماملۆستایەتی و پێشەوایەتییەکی باش بۆ ئێوە هەبوو، واتە: ئیبراهیم صلى الله عليه وسلم و شوێنکەوتوانی ئەوانەی لەگەڵیدا بوون مامۆستاو پێشەواو پێشەنگی چاکن بۆ ئێوە, ئێوەش شوێن ئەوان بکەون و بەڕائەت لە کافران بکەن [إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ] لە دوای ئەوەی ئامۆژگاری زۆری قەومەکەیان کردو بێ ئومێد بوون لێیان پێیان وتن: ئێمە بەرین لە خۆتان و دین و رێبازو ئەو بتانەیشی کە جگە لە خوای گەورە دەیانپەرستن [كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا] ئێمە کافرو بێباوەڕین بە دین و رێبازی ئێوە، وە لە نێوان ئێمەو ئێوەیشدا دژایەتی و ڕق و کینە سەری هەڵداو دەستی پێ کرد بۆ هەمیشەیی و هەتا هەتایی تا ئێوە لەسەر کوفرتان بەردەوام بن و شەریك بۆ خوا دانێن، تەنها مەرجیشمان ئەمەیە کە [حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ] تا بەتاك و تەنها ئیمان بە خوای گەورە دێنن و بە تاك و تەنها دەیپەرستن، وە دەستبەرداری کوفرو شیرکتان ئەبن ئەو کاتە لە دوژمنەوە ئەبن بە دۆست و خۆشەویستمان.

**هەروەها شێخ محمد رحمه الله**
دەڵێت: ومعنى الكفر بالطاغوت أن تبرأ من كل ما يعتقد فيه غير الله، من جني، أو إنسي، أو شجر أو حجر، أو غير ذلك، وتشهد عليه بالكفر والضلال، وتبغضه، ولو كان أنه أبوك، أو أخوك)

## واتای کوفر بە تاغوت بەم جۆرەیە:-

**یەکەم**: دەبێت بەرائەت بکەیت لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی عەقیدەیان پێیەتی، جا جنۆکە بێت یان هەر ئینسانێ بێت یان دار و درەخت بێت یان هەر شتێکیتر بێت.

**دووەم:** دەبێت شایەتی بدەیت واتە دەبێت بزانیت و بیگەیەنیت و کاری پێ بکەیت کە ئەو شتە کوفرە و گومڕاییە هەر کەسێک بیکات کافر و گومڕایە وە ڕقت لێی بێتەوە لە کارەکەو لەو کەسانەش کە ئەو کارە دەکەن.

**سێیەم**: لەمەشدا خاتری کەس نەگریت ئەگەر چی باب و برای خۆشت بن چونکە بابەتێک پەیوەندی بە الله تعالی بێت نابێت بیر لەبەرژەوەندی خۆمان و هیچ کەسێک بکەینەوە و پێویستە ملکەچ بین بۆ بڕیارەکانی.

الله ﷻ لەبارەو ئیبراهیممەوە دەفەرمووێ کەچی کرد و چی گوت لەبارەی تاغوتەکانی قەومەکەیدا. قال تعالی: ﴿وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ وَأَدْعُو رَبِّي عَسَىٰ أَلَّا أَكُونَ بِدُعَاءِ رَبِّي شَقِيًّا﴾ {مريم ٤٨}
واتا :- [وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ] وە لێتان دوور ئەکەومەوە لە خۆتان و لەو شتانەی کە ئێوە جگە لە خوای گەورە ئەیپەرستن [وَأَدْعُو رَبِّي] وە من بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە ئەکەم [عَسَى أَلَّا أَكُونَ بِدُعَاءِ رَبِّي شَقِيًّا (48)] بەدڵنیاییی من بێئومێد نابم لە دوعاو پاڕانەوەم، یاخود لە پەرستنی خوای گەورە .

قال تعالی: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ﴾ { محمد ١٩ }
ئەی محمد – صلى الله عليه وسلم - زانیاریت هەبێ و بزانە بەوەی کە هیچ پەرستراوێك بە حەق نیە شایەنی پەرستن بێ جگە لە زاتی پیرۆزی الله ﷻ نەبێ، وە بەردەوام بە لەسەر ئەمە.

زانایان رەحمەتی خوایان لێ بێ فەرموویانە کە خوای تعالى داوای کردووە لە مەخلوقات کە دەبێ هەمویان الله تعالى بناسن و مانای لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ بزانن، چونکە گەر الله نەناسی و بە نەزانی بیپەرستی و بێیتە ناو ئاینی ئیسلامەوە بە بێ ئەوەی واتاکەی بزانی ئەوا نەهاتویتەتە ناو ئایینەوە.

سەرنج:
ئایەتەکە نوسراوە ﴿فَاعْلَمْ﴾ ...
ئەمە لێرە فعلی داخوازی/فەرمانکردنە (امرە) واتا یانی بزانە...
کەواتا با بزانین اللە داوای لێ کردووین چی بزانین؟
{أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ}...
بزانە کە هیچ خوایەک نییە بە حەق شایەنی پەرستن بێ جگە لە اللە ﷻ..

ئەی موسەڵمانی ئازیز قورئان لەبەر پێگە و گەورەیی ئەم وشەیە دابەزیوە بۆ سەرجەم پەیامبەران (علیهم السلام) وە جن و انس هەمووی لەبەر خاتری ئەم وشەیە دروستکراون..

## کەواتا با بزانین لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مەرجەکانی چییە و مانی مەرجەکانی چین:

### مەرجی یەکەم: زانـیـن (العلم):

بزانە رەحمەتی خوات لێبێت مەرجی یەکەم پێویستە واتای ئەم وشەیە بزانی بە (نفي وإثبات)، نکۆڵی و چەسپاندن با بێین روونی بکەینەوە چۆن نکۆڵی بکەین و چەسپاوی بکەین لە وشەی لا اله الا اللە :
ئەی موسوڵمانی ئازیز کاتێک تۆ دەفەرموویت ( لَا إله ) واتا نکوڵی دەکەیت لەوەی کەوا هیچ پەرستراوێک نییە شایەنی پەرستن وبەندایەتی کردن بێت، لێردە موسوڵمانی ئازیز تۆ نکۆڵیت لە هەموو پەرستراوێک کرد.
پاشان دەڵێیت ( إِلَّا اللَّهُ ) واتا تۆ چەسپاندنت کەوا هەر خوای گەورە خۆی بەتاکوتەنها شایەنی بەندایەتی کردن وپەرستنە.
کەواتە ئەمە مانای لا إله إلا اللە بوو کە واجبە بیزانین.

### مەرجی دووەم: دڵنیایــی (الیقین):

واتا ئەبێ تۆ بێ شک و گومان بی لەوەی کە تەنها اللە شایەنی پەرستنەو هیچ کەسی تر یان شتێکی تر شەریکی نییە و هەر خۆی خاوەنی هەموو کەسێک وشتێکە ونابێ هیچ گومانێکت لە دڵا هەبێ .

### مەرجی سێیەم: نیازپاکی (الإخلاص):

واتا هەموو عیبادەت و کار و کردەوەیەک پێویستە لە پێناوی اللە ﷻ بێت و نیەتت بۆ زاتی بەرزی یەکلایی بکەیتەوە . قال تعالی: ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ {البینة ٥}
واتا: فەرمان کردن بە یەکخواپەرستی
[وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ] وە ئەهلی کتاب فەرمانیان پێ نەکرابوو تەنها بەوە نەبێ بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن بە ئیخلاص و دڵسۆزی و نیاز پاکییەوە وە شەریکی بۆ دانەنێن.

## مەرجی چوارەم: ڕاستگۆیی (الصـدق):

بزانە رەحمەتت لێبێت کەوا پێویستە راستگۆ بی لە بەیەکگەیاندنی ئەم مانایە بە نییەت و زمان و کردەوە لەبەرئەوەی خوای پەروەردگار ئیمانەکەمان تاقی دەکاتەوە وە بەڵگەش کەلامی زاتی بەرزی ( اللّٰه )یە کە دەفەرموێیت:

﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴾ {العنكبوت ٢}

واتە: ئایا خەڵکی وا گومان ئەبەن و وا حساب ئەکەن کە وازیان لێ بهێنین تەنها بەوەی کە بڵێن ئیمانمان هێناوەو تاقی نەکرێنەوە؟

{وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ} وە بەدڵنیایی ئوممەتانی پێش ئێوەیشمان تاقیکردۆتەوە ﴿فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ ﴾ {العنكبوت ٣}

ئەوانەی کە بە زمانیان ئەڵێن: ئێمە ئیمانمان هێناوە تا دەربکەوێ و خوای گەورە ببینێت کە کێ راستگۆیەو کێ درۆزنە.

مەبەست لەم ئایەتەی اللّٰه تعالی ئەوەیە کە دەبێ راستگۆ بین و بەراستی اللّٰه بپەرستین و مونافیق نەبین پەنا بە اللّٰه .

## مەرجی پێنجەم: خۆشەویستی (المحـبە):

ئەی موسوڵمانی ئازیز پێویستە وشەی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ)ت بەڕاستی خۆشبوێت و بە کردەوە و ڕەفتار بیسەلمێنی و خۆشویستن و رق لێبونەوەت هەر لە پێناو ئەم وشەیە بێت و إسلام و ئەوەی لە إسلام و فەرمانی اللّٰه ﷻ و رسولەکەیت ﷺ خۆشبوێت، وەکاتێک گوێت لە فەرمانێکی اللّٰه ﷻ بوو ئەوا یەکسەر ملکەچی بی و بەهەمان شێوە فەرمانی پێغەمبەرەکەشی ﷺ کە رەحمەتە بۆ هەموو جیهانیان.

## مەرجی شەشەم: ملکەچبون و پابەندبون (الانقیـاد):

واتا تەسلیمی اللّٰه ﷻ بین و ملکەچی بین و فەرمانەکانی جێ بەجێ بکەین و پابەندبین پێوەی.

هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرموێت: ﴿وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ﴾ {الزمر ٥٤}

واتا: وە بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورەو تەوبە بکەن وە خۆتان تەسلیمی خوای گەورە بکەن.

## مەرجی حەوتەم: ڕازی بوون (القـبول):

واتا ئەی موسوڵمانی خۆشەویست دەبێ قەبوڵی بکەی ئەوەی خوای تعالی فەرموویەتی و فەرمانی پێ کردووە و ڕازی بیت پێی بە قبوڵبوونێک کە بە دڵ و بە گیان قەبوڵی بکەی و هیچ ڕەخنەیەک نەگری لە هیچ فەرمانێکی زاتی بەرزی اللّٰه ﷻ.

## مەرجی هەشتەم : کافربوون {الکفر}:

وە لە پاش هەموو ئەمانە ئەم خاڵە گرینگترینیانە کە بریتیە لە: کافر بوون بەوەی جگە لە اللّٰه ﷻ بپەرسترێ(الکفر بما یعبد من دون اللّٰه): واتا ئەبێ بێ بەری بیت لە هەموو شتێ کە بپەرسترێ یاخود طاغوت بێت یاخود شەریک بریار بەیت.

